# بالاپۆشی

# ئافرەتی مسوڵمان

چاپی شەشەم



نەوال محمد عبد

التفسير
2011

# باڵاپۆشی ئافرەتی موسوڵمان

ئامادەکردنی

نەوا محمد سعید

چاپی شەشەم



ناوی کتێب بەکوردی: بالاپۆشیی ئافرەتی مسوڵمان
ئامادەکردنی: نەوا محمد سعید
بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
نەخشەسازی ناوەوە: جمعه صدیق کاکه
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: شەشەم ١٤٣٢ك — ٢٠١١ز
تیراژ: ٣٠٠٠ دانە

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (١٧٨٣) ی ساڵی ٢٠٠٥ دراوەتێ

التفسير
بۆ بلاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨ - ٢٥١٨١٢٨
مۆبایل: ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٣٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشـکەشــە

- بەو ئافرەتانەی بە بریاری خوا ڕازین ، کە خۆیان بـاڵاپۆش بکـەن بـەو شـێوەیـەی، کـە خـواو پێغەمبـەر پێـی ڕازین .
- بـەو ئافرەتـە بەرێزانـەی پۆشـاکی ئیسـلامیان لـەلا پیـرۆز و پەسـندەو ، بەناسـنامەی ڕەسـەن و راستەقینەیـان دەزانن
- بــەو خوشــکە مولتەزیمانــەی ، کــە بــۆ ســاتە وەختێکـیش لەبـەرچاوی پیـاوی بێگانـەو، لـەژێر هـەر بـار و ڕەوش و گوشـارێکدا بـن ، سـەرپۆشـەکەیـان لەسـەریان ناکەنەوە .
- بەو ئافرەتانەی بەگوێرەی مـۆدەو بـە جلو بـەرگی ئـافرەتی ڕۆژئـاوایی خۆیـان پۆشـتە ناکـەنو ، بــە ڵکـو بەگوێرەی کەتەلۆکی ئیسلام جل دەپۆشن .
- بەو ئافرەتانـەی، کـە باڵاپۆشیی بـە داب و نـەریتی وڵاتانی بێگانەی دانانێن و، لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسن.

# پێشەکی چاپی پێنجەم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغره ، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا، وسيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له و أشهد أن محمدا عبده ورسوله.

أما بعد:

له کاتێک ئەم نامیلکەیە دەنوسرێ و بڵاو دەکرێتەوە، کە جیهانی ئیسلامی بە یەکێک لە قەیرانە هەستیارەکاندا گوزەر دەکات، کە ئەویش قەیرانی بالآپۆشییو، بە هەڵە حاڵی بون لە چەمکی ڕاستەقینەی بالآپۆشیی (حجاب)ە. کە بۆتە پەتایەک گشت وڵاتی مسوڵمانانی گرتۆتەوە، لەوانەش کوردستانی خۆمانە، کە دەبینرێ ئافرەت خۆی داپۆشیوەو بالآپۆشیی کردوە، بەڵام بالآپۆشیەک، کە لەگەڵ یاساو ڕێو شوێنی خواو پێغەمبەر تێک ناکاتەوە. بالآپۆشییەکە، کە حەزو ئارەزوەکان فەرماندەو زاڵە،

بالاپۆشییەک بەناو پۆشتەیە، ئەگینا نیمچە ڕوتە، کە کەمێک لە سینگ بە ڕوتیو بە زەقیو ئەندامی تری لەش بە دەرەوەیە.

بالاپۆشییەک و پۆشاکێکە، کە گشت مەرجەکانی تێدا نەهاتۆتە دی و، سەرنج ڕاکێشەرو مەیلدەری پیاوانە.

دیارە خەڵک بە گشتی و ئافرەتان، لە چەمک و تێگەیشتنی بالاپۆشیی، بە هەڵە و خوارو خێچی حاڵین، پێوەر لایان، پێوەری حەزو مۆدەیە، نەک قورئانو سوننەت، نەک ڕەزامەندی خوا و بەدەستهێنانی بەهەشت.

هەر بۆیە پۆشاک و جل و بەرگ و بالاپۆشییان، بە چەندان شێوازی بڕین و مۆدەی ناشەرعییەوە دەبینرێ، کە جیاوازی زۆری لەگەڵ پۆشاکی تردا نیە.

لەو جۆرە پۆشینانەش، سەرپۆشێکی عادەت پۆشراو لەگەڵ چاکەت و پانتۆڵ، لەبەرکردنی پانتۆڵی تەسک و بەدی و سەرپۆشێک، کە سینگ و بەرۆک بەزەقی دیار دەخات، لەبەرکردنی تەنورەیەکی تەسکو بلوزێکی تەسک، کە جەستەی بە زەقی دەردەخات لەگەڵ سەرپۆشێک، کە بە پشتیەوە شۆڕ دەکاتەوە، یان

لەبەرکردنی جبەیەک، کە سەرپۆشەکە بە دواوەدا شۆر دەکرێتەوە و سینگ و بەرۆک بە زەقی دەردەخرێ، ئەمەو شێوازی تریش، کە لەگەڵ مەرجە شەرعیەکانی بالاپۆشیی تێک ناکاتەوە و، بە پێوەری قورئان و سوننەت، بە بالاپۆشیی شەرعی هەژمار ناکرێت و، گاڵتەکردنە بە پۆشاکی شەرعیی.

ئەو شێوازانەی، کە باس کران، گشتی تێنەگەیشتن و سنور بەزاندنی یاسای خوایە و، لارێ بونە لە چەمک (مفهوم)ی ڕاستەقینەی بالاپۆشیی (حجاب)، کە بریتیە لە داپۆشینی هەمو جەستە، بە قوماشێکی فراوان، هەر لە تۆقی سەرەوە، تا پێیەکان، بە بێ دەرکەوتنی هیچ بەشێک لە ئەندامی جەستەی ئافرەت.

جا بۆ ئەوەی خوشکان و دایکان و مسوڵمانان بە گشتی لە حەقیقەت و مێژو و پێناسە و بەڵگەی فەرزیی بالاپۆشیی شارەزا و پڕ زانست بن، ئەم نامیلکەیان دەخەینە بەردەست، تا بە ڕۆشنبینی و بەرچاوڕونیەوە، کەتەلۆکی پۆشاکی ڕاستەقینەی ئافرەتان لە ژیانی

ڕۆژانەدا، لە کاتی چونە دەرەوە، وەک ئەرکێکی خوایی جێبەجێ بکرێ و بناسرێ.

لە خوام داوایە دڵی هەموان، بە تایبەتی ئافرەتان گوشاد و ڕۆشن بکات، تا ئایەتەکانی خۆی پیادە بکرێ، بشمانکات بە نمونەیەکی زیندو جوانی ئیسلام و، پێوەرەیش تەنها قورئان‌و سوننەت بێت، نەک حەزو ئارەزو.

نەوا محمد سعید
١٧ ربیع الاول ١٤٣٠
٢٠٠٩/٣/١٤

# مێژوی باڵاپۆشیی

لەو گومان و خەیاڵە پوچ و باوەی هەیە، بە تایبەتی لە لای ڕۆژئاواییەکان ئەوەیە، کە باڵاپۆشیی (حجاب)ی ئافرەتان، سیستەمێکە ئیسلام دایهێناوە، کە نە لە پێش ئیسلام هەبوە، نە لە دورگەی عەرەب و نە لە شوێنی تر هەبوە. وای لێهاتوە لای ئەوان ئافرەتی باڵاپۆش (محجبة)، واتە ئافرەتی مسوڵمان، یان ئافرەتی تورکی[1]، کە لە

---

باڵاپۆشی لە تورکیا ناوبانگی دەرکردو بڵاوبۆوە، نەک لە بەرئەوەی (نەریتێکی) تورکیە، وەک ئەوانەی بە هەڵە و بە گومانەوە وا حاڵی بون، بەڵکو باڵاپۆشی وەک دیاردەیەکی پابەندبونی ئافرەتە تورکیەکان بو بە ئیسلام. کەواتە باڵاپۆشی وەک دیاردەیەکی پابەندبونی ئافرەتە تورکیەکان بو بە ئیسلام. کەواتە باڵاپۆشی لە تورکیا تەنها هی ئیسلام بوە. تورکەکان تەنها لە میانە و لە ڕێی ئیسلامەکەیانەوەی پێی ئاشنا بون، چونکە ئەوان لەو گەلانەیان وەرگرت، کە لە ئیسلامەوە فێربون و، ئیسلام باڵاپۆشیان لەسەر فەرز دەکات.پاشان باڵاپۆشی - بە هەر شێوەیەک بێت بە درێژایی

ڕوانگـــەی ئەوانـــەوە نوێنەرایـــەتی ئیســـلامی دەکـــرد، لەبەرئەوەی (تورکیا) خانەی خەلافەت بوە. ئەم گومان و خەیاڵەش نەزانی ئەوان بەدەردەخات، نەک تەنها بە ڕاستیەکانی خودی ئیسلام، بەڵکو بە ڕاستیەکانی مێژو و دەقەکانی ئەو کتێبە ئاینیانەی، کە بۆی دەمارگیرن و هەوڵ و کۆشش ناکەن، کە بیخوێننە و پێیدا بچنەوە، بە تایبەتی (تەورات و ئینجیل).

جا هەر کەسێک کتێبەکانیان بخوێنێتەوە، بۆی دەردەکەوێ و دەزانێ کە بالاپۆشیی ئافرەتان لە نێوان عیبرانیەکان لە سەردەمی ئیبراهیم (علیه السلام)دا باو بوە، تەنانەت لەسەردەمی سەرجەم پێغەمبەرەکانیان باو بو، هەتا دەرکەوتنی نەصرانیەت.

لە کتێبەکانی (العهد القدیم و الجدید)دا چەندەها جار ئاماژە بە ڕوپۆشی کراوە.

---

ڕۆژگار- ئەسڵێکە لە گشت جیهانی ئیسلامی ڕەچاو کراوە، نەک تەنها لە تورکیا.
نوسەری ادلة الحجاب لە کتێبی (واقعنا المعاصر)ی محمد قطب گواستۆتەوە.

ئـەوەتا لـە (الاصـحاح)ی بیسـت و چـوار لـە سـفر التكـوین دا هـاتوە، کـەوا (رفقـە)چاوەکـانی بـەرز کردۆتـەوە، ئیسـحاقی بینیـوە. جـا لەسـەر وشـترەکەی دابـەزیوە و بـە کۆیلەکەی گوتوە: 'ئەم پیاوە کێیە، کە لە کێڵگەکە دەڕواو دێت بۆ دیدارم' کۆیلەکە گوتی 'ئەوە گەورەمە'.

جا ئەویش بە پەچەکەی ڕوی خۆی داپۆشی.

هـەروا لـە (الاصـحاح)ی سـی و هەشـت لـە (سـفر التكـوین)دا هـاتوە کـە: (ثامـار) ڕۆیشـت و لـەماڵی بـاوکی دانیشت، جا کە ماوەیەکی درێژی خایاند، پۆشاکی بێوەژنی داکەند و، ڕوی بە پەچە داپۆشی و خۆی پێچایەوە.

لە (الاصحاح)ی سێیەم لە (سفر اشعیا) هاتوە، کە خـوا سـزای کچـانی (صـهیۆن) دەدات لەسـەر خـۆ بـە دەرخستنیان بە ڕازاوەیی و، شانازی کردنیان بـە خرِنگـە و زرنگەی پاوان (خلخال)ەکانیان... .

هـەروەها بـولس لـە نامەکـەی (کورنثـوس)ی یەکـەم، دەڵێ: (ڕوپۆش (نقاب) بـۆ ئافرەت شـەڕەفـە)، ئافرەت لـە لای ئـەوان کـاتێ بگـەیشتبایە بـە پیـاوی بێگانـە، پەچـەی دەپۆشی.

کڵێسە (کنیسە) لە سەدەکانی ناوەڕاست دا، لایەکی بۆ ئافرەتان تایبەت دەکرد، تاوەکو تێکەڵ بە پیاوان نەبن.

(ڕۆژگارێکیش کڵێسەی (أرثوذوکسی) بڕیاری بێ بەش کردنی ئافرەتی دا، کە مافی لە کۆمەڵگەدا هەبێت، جا لەسەری یاساغ (منع) کرد، کە ئامادەی کۆڕو کۆبونەوەو دەعوەتی نان خواردن ببێت و. بالاپۆشیی لەسەر پێویست کرد بە بێدەنگیو بە ئارامیەوە، هەروا بڕیاریدا، کە ئافرەت هیچی بۆ نیە، تەنها بەر فەرمانی مێردبێ و، کاری ڕستنو چنین بکاتو، چێشت دروست بکات. ئەگەر لە ماڵیش دەرچو، دەبێ خۆی داپۆشێ، هەر لە تۆقی سەریەوە، تا پەنجەی پێیەکانی) [1] هەر بۆیە ئاسەواری بالاپۆشیی لە پۆشاکی ئافرەتە (راهبە)کانی دیانەکان، بە ئاشکرا بەرچاو دەکەوێ، یان لە کاتی ئاهەنگی بوک گواستنەوەدا، کە ڕوی بوکی دیانەکان بە تارا و پەچەیەکی تەنکەوە دەپۆشی، ڕەنگە ئەمەش لە پاشماوەی ئاینیان بێت.

---

(حقوق المرأة في الاسلام) لە ئەیامەکاني جەزائري ل٧.

عەرەبەکان لە سەردەمی جاهیلی (پێش ئیسلام)دا، بالاپۆشی‌و ڕوپۆشی لە ناویاندا باو بو، کە ڕەنگە پاشماوەی ئاینی ئیبراهیم بێت، کە عەرەبەکان وەریان گرتبێت، هەروەک خەتەنە کردن و هۆزەبانە (عقیقە) و شتی تریان وەرگرتبو. لە هەمان کاتیشدا دەم‌و چاو دیار خستنیش هەبوە، کە ئەمە حاڵی زۆرینەی کچانی عەرەب بوو. هەروەها چەندەها شێوازی جۆراو جۆری خۆ دەرخستنی ئافرەتان بە ڕازاوەیی (تبرج)یاندا تێدا بڵاو بوە، وەک خوای گەورە باسی کردوە، کەوا (تَبَرُّجَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ)یە، کە دەفەرموێ: ﴿...وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ... وەک دەورانی زەمانی پێشو، جوانی‌و ڕازاوەیی خۆتان نیشان مەدەن (٣٣)﴾ الأحزاب.

ئەو کات ئافرەتان پۆشاکێکی مرواری داریان دەپۆشی و، بە ناوەڕاستی ڕێگادا دەڕۆیشتن، خۆیان بۆ پیاوان نمایش دەکرد[١]

---

(١) (تفسير غرائب القران) للنيسابوري (١٢/١٠) هامش الطبري

هەروا پۆشاک و کاڵای ئافرەتانی سەردەمی جاهیلی، تەنک‌و شاش‌و بریسکەدار بوە، هەروەها پۆشاکێکیان هەبوە، کە پێی گوتراوە (الدثار) واتە داپۆشەر، کە باڵاپۆشییەک بوە، گشتِ جەستەی داگرتوە، کە ئافرەت هەتا ناوەڕاستی دەیبەست و، نیوەکەی تری شۆڕ دەکردەوە.[١]

## بەڵگەی فەرزیی باڵاپۆشیی (الحجاب)

بە پێی دەقی قورئان، باڵاپۆشیی لەسەر ئافرەتی مسوڵمان فەرزو پێویست کراوە، وەک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَـٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ ئەی پێغەمبەرا بە ژنەکانت‌و کچەکانت‌و ئافرەتانی بڕوادار بڵێ: با خۆیان بە عەبایەکانیان پۆشتە بکەن، ئەم کارە باشتر دەبێتە هۆی

---

(١) (المرأة العربية في جاهليتها واسلامها) (١/١١٠ ١١١).

ئەوە  کە بناسرێن ئەوانە ئافرەتی داوێن پاکن و، لە لایەن کەسانی لە دین دەرچو و خراپە کار ئازار نەدرێن، خودا لە خەتا دەبورێ و دلۆڤانە(٥٩)﴾ الأحزاب.

سەبارەت بە سەروسینگ داپۆشینیش دەفەرموێ:

﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ...

بە ئافرەتانی بڕواداران بڵێ، با چاویان دانەوێنن‌و شەرمی خۆیان بپارێزن‌و جوانی‌و ڕازاوەیی خۆیان وەدەرنەخەن؛ مەگەر ئەوانەی دەردەکەون (دەست‌و دەم و چاو)، با سەر پۆشەکانیان، تا سەر یەخەو بەرۆکیان دابپۆشی(٣١)﴾ النور.

لە فەرمودەی پێغەمبەریشدا هاتوە، کە: ((أن أسماء بنت أبي بكر دخلت على النبي ﷺ وعليها ثياب رقاق، فأعرض عنها وقال: يا أسماء إن المرأة إذا بلغت المحيض لم تُصلح أن يُرى منها إلاّ هذا و هذا وأشار إلى وجهه وكفّيه... ئەسمای کچی ئەبوبەکر چوە ماڵی پێغەمبەر، کە پۆشاکێکی تەنکی پۆشیبو،

پێغەمبەریش پشتی تێکردو فەرموی. ئەسما ! ئافرەت گەر بلوغی بو، خوێنی بێنوێژی بینی، بۆی دروست (جائز) نیە، جگە لەمەو لەمەی دەرکەوێ، ئاماژەی بۆ دەست و دەم و چاوی کرد)). رواه ابو داود، حدیث حسن. بمجموع طرقه[1] جا لەم بڕیارانەی خوا و پێغەمبەر دەرکەوت، کە بالاپۆشیی و خۆ داپۆشین، فەرزە لەسەر هەر ئافرەتێک، کە بلوغی ببێ و شایەتمان بێنیو نوێژەکان ئەنجام بدات و ئەرکەکانی ئیسلام پیادە بکات.

جا ئەم دو ئایەتە و فەرمودەی پێغەمبەر دەربارەی بالاپۆشیی، بیانو بڕی ئەوانەیە، کە داوای بەڵگە دەکەن.

## پێناسەی بالاپۆشیی

(ابن العربی المالکی) لە تەفسیری فەرمایشتی خوای گەورە (يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَـٰبِيبِهِنَّۚ) گوتویەتی خەڵک دەربارەی(جلباب) لەسەر چەند بێژە (لفظ)ێکی لێک نزیک

---

[1] جلباب المرأة المسلمة في الكتاب والسنة - محمد ناصرالدين الالباني - سلسلة كتاب الطريق الى الجنة (٨،٧).

جیاران، بەڵام ئەوەی جێی متمانەو پشت پێ بەستنە ئەوەیە، کە (جلباب) ئەو پۆشاکەیە جەستە دادەپۆشێ.

دەکرێ شێوازی (جلباب) بە پوختی پێناسە بکەین و بڵێین: بریتییە لە پۆشاکێکی پان و فراوان، کە لەسەر جل‌و بەرگی ئافرەت لەبەر دەکرێ، کە هەر لە تۆقی سەریەوە، تا پێیەکانی دادەپۆشێ.

کەواتە (جلباب) بە پێی ئەم پێناسەیە بەو (عەبا)یە دەچێ، کە لە ناو ئافرەتانی عێراق باو بوە و، ئێستاش هەندێکی دەیپۆشن[1]

ئیمام (بغوی) لە (تفسیر)ەکەیدا لە بەرگی (٣) لاپەڕە (٥٤٤) دەربارەی (جلباب) گوتویەتی: (بریتیە لەو چارشێوەی، کە ئافرەت بەسەر پۆشاک‌و سەرپۆشەکەیەوە شۆڕ دەکاتەوە و خۆی پێ دادەپۆشێ).

ئیبن حەزم گوتویەتی (جلباب لە زمانی عەرەبدا، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی پێ دواندوە، ئەوەیە کە هەمو

---

المفصل في احكام المرأة و البيت المسلم في الشريعة الاسلامية، د. عبدالكريم زيدان.ج٣.

جەستە دادەپۆشێ، نەک هەندێکی داپۆشێ).

ئیبن کثیر گوتویەتی (جلباب): ئەو بالاپۆشەیە، کە بەسەر سەرپۆش دا دێتە خوارەوە، وەک پۆشاکی ئاو دامان پۆشی ئەمڕۆیە).

شێخ محمد ناصرالدین الألبانی گوتویەتی: (جلباب) ڕەنگە ئەو عەبایە بێت، کە ئافرەتانی (نجد) و عێراق و شوێنی تر بەکاری دێنن.

جا بە پێی ڕاستترین قسە، کە پێشتر باسکران، (جلباب) ئەو پۆشاک و قوماشەیە، کە ئافرەت لەسەر جل و پۆشاکیەوە، خۆی پێ وەردەپێچێ و خۆی پێ دادەپۆشێ.[1]

کەواتە بە پێی ئەم هەمو پێناسەو ڕای زاناو شەرعناسانە، دەکرێ بڵێین: (جلباب)، کە لە قورئان دا هاتووە، دەبێ ئافرەتی بڕوادار خۆی پێ داپۆشێ، بریتییە: لەو قوماش و عەبایەی، کە بەسەر سەرپۆش و جل و بەرگ و پۆشاکی ئافرەتدا دادەدرێ.

لەبەرئەوە پێویستە ئافرەتی بڕوادار لەوە تێ بگات، کە

---

جلباب المرأة المسلمة – للألباني، ص٨٢

عەبا پۆشین وەک لە ئایەتەکەدا هاتوە: ﴿...يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ..﴿٥٩﴾ الأحزاب﴾ فەرمانێکو بڕیارێکی خوایە، دەبێ ئافرەتی بڕوادار لەسەر خۆی جێبەجێ بکات، لە گشت کاتو ڕۆژگارێک، کە نابێ تەنازولی لەسەر بکات.

## لە ژێر پۆشاک دەبێ پانتۆڵ لەبەر بکرێ

دیارە ئافرەتی مسوڵمان، کە جل و بەرگی حیشمەت و داوێن پاکی دەپۆشێ، پێویستە لە ژێر جلەکەی پانتۆڵ لەبەر بکات، چونکە ئافرەت پۆشتە تر دەکات و لە کاتی خلیسکان و سوار بونی ئۆتۆمبیل دا، قاچ و عەورەتی لە دەرکەوتن دەپارێزێ.

جا لەمبارەوە فەرمودەی پێغەمبەر هاتوە، ئەوەتا ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) گوتویەتی، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (**رحم الله المتسرولات من النساء**... خوا ڕەحم و بەزەیی بەو ئافرەتانە بکات، کە پانتۆڵ لە ژێر پۆشاکیان لەبەر دەکەن) رواه الحاكم في (تأريخه) والبيهقي في (شعب الايمان).

دیارە (سروال) کە لەم فەرمودەیە هاتوە بۆ داپۆشین (ستر)ە، (سروال)یش واتە: پانتۆڵ[1] و دامانپۆش‌و دەرپێ‌و ئاوەڵکراس.

هەروەها عەلی کوڕی ئەبوتالیب گوتویەتی:( **كنت قاعداً عند رسول الله ﷺ عند البقيع في يوم مطير، فمرت امرأة على حمار فهوت يد الحمار في وهدة، فسقطت المرأة فأعرض عنها النبي بوجهه فقالوا: يا رسول الله إنها متسرولة. فقال: اللّهم اغفر للمتسرولات من أمتي. يا أيها النّاس اتخذوا السراويلات فإنها من استر ثيابكم، وحصّنوا بها نساءكم إذا خرجن**... لە ڕۆژێکی باراناویدا لە(بقیع) لەلای پێغەمبەری خوا دانیشتبوم، ئافرەتێک لەسەر گوێدرێژێک

---

**هیچ کەسێك بە هەڵە لە مانای پانتۆڵ تێ نەگات، وا بزانی دروست (جائیزە)ە ئافرەت پانتۆڵ بە تەنها و بە بێ پۆشاکێك بەسەریدا بێتە خوارەوە لەبەر بکات، چونکە بە تەنها لەبەر کردن ئەندامی جەستەی بە زەقی دەردەکەوێ، کە حەرامە دەرکەوتنی . بەڵام گەر ئافرەت بالای پۆشی، بەو شێوەیەی خوا فەرمانی کردوە، هەیناکە لە ژێر پۆشاکیەوە ئەو پانتۆڵە لەبەر بکات، کە ئێستا باوە، چونکە لە ژێرەوە ئەندامی هەستیاری دەرناکەوێ.**

بو، جا قاچی گوێدرێژەکە کەوتە ناو چاڵێکەوەو، ئافرەتەکە کەوت. پێغەمبەریش ڕوی لێ وەرگێڕا. هاوەڵەکان گوتیان. ئـەی پێغەمبـەری خـوا ئـەو ئافرەتـە پـانتۆڵی لەبـەرە. پێغەمبەریش فەرموی: خودایە لە گوناهی ئەو ئافرەتانەی ئوممەتم خۆش ببە، کە پانتۆڵ لەبەر دەکەن.

خەڵکینە! با ئافرەتەکانتان پانتۆڵ لەژێر پۆشاک لەبەر بکەن، چونکە باشترین پۆشتە و پۆشاکتانە، جا کە چونە دەرەوە، با لەبەری بکەن و خۆیانی پێ بپارێزن) أخرجه بن عدی فی (الکامل) و العقیلی والبزار والبیهقی فی(الأدب)[1]

## بالاپۆشیی بۆچی؟!

حیکمەت و فەلسەفەی بالاپۆشیی دەکرێ بە پوختی چڕ بکەینەوە:

بەر لە هەمو شتێک بالاپۆشیی فەرمانی خوایەو، تەنها بۆ ئافرەتی بڕوادارە، چونکە خوای گەورە فەرمانی پۆشینی، ئاڕاستەی ئافرەتی بڕوادار دەکات: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ ﴿٣١﴾

---

المفصل في أحكام المرأة وبيت المسلم-د.عبد الكريم زيدان. ج٣.

...﴾ النور (ونساء المؤمنين).

کەواتـە خـوای گـەورە چ بڕیـارو فـەرمانێک بـدات، پێویستە ئافرەتی بڕواداربە بێ زانینی حیکمـەت و هۆکار، لەسەر خۆی جێبەجێ بکات.

خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ... ئەگەر خوا و پێغەمبەرەکـەی فـەرمانیان بەهـەر کارێـک دا، هـیچ پیاوێک و هیچ ژنێکی خاوەن باوەڕ، بۆیان نیە پەسەندی انەکەن (٣٦)﴾ الأحزاب.

(لەبـەر ئـەوە بالاپۆشـیی بـە ئیمانـەوە پـەیوەستە، ئـەوەتا چەند ئافرەتێکی بەنی تەمیم دەچنە ماڵی عائیشەی دایکی بڕواداران، پۆشاکێکی تـەنکیان لەبـەر بوە. خـاتو عائیشـەش پێی گوتـون: **إن كنتن مؤمنات، فلـيس هـذا بلبـاس المؤمنات، وإن كنـتن غيـر مؤمنـات، فتمـتعن بـه...** ئەگەر ئێوە ئافرەتی بڕوادارن، ئەم پۆشاکە پۆشاکی ئافرەتی بڕوادار نیە، جـا گـەر ئێـوەش بـڕوادار نـین، لەبـەری کـەن و پێی رابوێرن) معالم السنن (٤/٣٧٦). ئافرەتێکی تازە بـوک

بــو چــوە لای خــاتو عائیشــە، کــە سەرپۆشــێکی (قبطــی) ڕەنگــاوڕەنگی پۆشــیبو، خــاتو عائیشــەی دایکــی بــڕواداران گوتی:(لم تؤمن بسورة النور امــراة تلــبس هــذا... ئەو ئافرەتەی ئەم جۆرە سەرپۆشە بپۆشێت، بڕوای بە سورەتی نور نیە) تفسیر القرطبی (٢٤٤/١٤) [1]

هەروا بالاپۆشیی؛ پاک داوێنی [2] و عیفەتو پارێزکاریەو، ناسینی ئەو ئافرەتەیە بە پارێزەری داوێنو دڵو چاو گوێ لـە گونـاه و تـاوانو سـەرپێچی خـوا. هـەروا تـا کەسانی دڵ

---

[1] ادلة الحجاب - د. محمد بن احمد بن اسماعيل المقدم- طبعة خاصة بمؤسسة الحرمين الخيرية بالرياض ص٩٨

[2] ڕەنگە هەندێک کەس ڕەخنە بگرن و بڵێن ئافرەتی باڵا پۆشمان بینیوە، کاری خراپە دەکات و بێ ڕەوشتە، ئێمەش بەو ڕەخنە گرانەی ناحەز بە ئیسلام دەڵێین: ئەو ئافرەتانەی ئێوە بینیوتانە کاری خراپە کاریان کردوە، یان سواڵکەریی دەکەن؛ ئەوانە بە پارەیەکی کەم و شتومەکی بێ نرخ بە کرێ گیراون، بۆ ناشیرین کردن و سوک کردنی باڵا پۆشی. هەروەک لە سەردەمی ڕژێمی بەعس لە ساڵی هەشتاکان لە شاری کەرکوک (٦٠) ئافرەت بە کرێ گیرا بون پۆشاکی ئیسلامی بپۆشن و کاری خراپە کاری بکەن. ئەوەبو دوایی ئاشکرا بو بە دان پیادانانی یەکێکیان. ئەمە و چەندەها کاری لەم شێوە هەیە، کە خەڵک پێی ئاگادار نین.

نەخۆش و بەدکارو بێ ڕەوشت، چ بە دەست چ بە زمان، نەتوانن ئازاری بدەن‌و، تانەو تەشەری لێبدەن، وەک خوای گــەورە ئامــاژەی پێــدەکات‌و دەفــەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَـٰبِيبِهِنَّۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن يُعۡرَفۡنَ فَلَا يُؤۡذَيۡنَۗ ...﴿٥٩﴾ الأحزاب﴾

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەو ئافرەتانەی، کە خۆیان پۆشــتە ناکــەن لــە لایــان ڕەوشــت نــزم‌و نــەفس نــزم‌و بــەدکاران، توشــی تانــەو تەشــەرو ئازار دەبـن، چونکـە جلـە نیمچـە ڕوت‌و تـەنک‌و تەسکەکەیان، هۆکارو سەرکێشـی تانــەو تەشــەرو ئازاردانیانــە، واقیعــی ئــەمڕۆش ئەمــە دەسەلمێنێت و سەلماندویەتی.

## مەرجەکانی پۆشاکی ئافرەتی مسوڵمان

دوای ئــەوەی مێــژوی بالاپۆشــیی و، بــەڵگــەی فــەرزیی بالاپۆشــیی و، پێناســەی پۆشــاکی ئــافرەتی مســوڵمان و، بەکورتی حیکمەتی بالاپۆشییمان باس کرد؛ ئێستاش باسی

مەرجە پێویستەکانی بالاپۆشییو پۆشاکی ئیسلامی دەکەین.

(ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەرو، شوێنەواری پێشینەکان بکەیت، بۆت دەردەکەوێ، گەر ئافرەت لە ماڵی خۆی چوە دەرەوە، لەسەری پێویستە، کە هیچ شتێک لە زینەت و جوانی و ڕازاوەیی خۆی وەدەرنەخات و، گشت جەستەی داپۆشێ، جا پۆشینەکە بە هەر پۆشاکێک بێت، گرنگ ئەوەیە ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدا بێتە دی)[1]:

١-پۆشاکەکە، دەبێ هەمو جەستەی ئافرەت داپۆشێ، جگە لە هەردو دەست و دەم و چاوی.

٢-پۆشاکەکە، نابێ لە خودی خۆیدا ڕازاوە و سەرنج ڕاکێش بێت.

٣-پۆشاکەکە، دەبێ پان و فراوان بێت و، تەسک نەبێت.

٤-پۆشاکەکە، نابێ بۆندار بکرێ.

٥-پۆشاکەکە، نابێ بە پۆشاکی پیاوان بچێت.

---

[1] ادله الحجاب.

٦-پۆشاکەکە، دەبێ ئەستور بێت و تەنک نەبێت، کە جەستەی تێدا وەدەرکەوێ.
٧-نابێت بە جل و بەرگی ئافرەتی کافر بچێت.
٨-پۆشاکەکە، نابێ بۆ ناو شۆرەت و فیز کردنەوە بێت.

ئێستاش بە وردی بە پێی قورئان و سوننەت و، وتەی زانایان، باس لەم هەشت مەرجە دەکەین، کە دەبێ هیچ مەرجێکی فەرامۆش نەکرێ، یان کەمتەرخەمی تێدا نەکرێ.

## مەرجی یەکەم: پۆشاکەکە دەبێ هەمو جەستەی ئافرەت داپۆشێ، جگە لە هەردو دەستو دەم و چاوی.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ

﴿أَيْمَنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُواْ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّۚ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ ...بە ژنانی باوەڕداریش بێژە، با چاویان دانەوێنن و شەرمی خۆیان بپارێزن‌و جوانی‌و ڕازاوەیی خۆیان وەدەرنەخەن، جگە لەوانەی دەردەکەون (دەستەکان‌و ڕوخسار). با سەرپۆشیان تا سەر سینگ‌و بەرۆکیان دابپۆشێ و، جوانی و ڕازاوەیی خۆیان نیشان نەدەن، مەگەر بۆ مێرد، یان باوکیان، یان خەزوریان، یان کوڕی خۆیان، یان زڕکوڕیان، یان براکانیان‌و برازایان، یان کوڕانی خوشکەکانیان، یان ژنانی هاو بڕوایان، یان ئەو پیاوەی سەر بەوانن‌و، هەر نیازیان بە ژن و نیەو توانای جوت بونیان نیە، یان منداڵانێ، کە نەگەیونە ئەو تەمەنەی ئارەزوی ئافرەتانیان هەبێت، با پێیەکانیان بە زەویدا نەدەن[1] (تادەنگی

---

[1] لە سەردەمی نەفامی و پێش ئیسلام، ئافرەتان پاوانە (خلخال)یان لە قاچ دەکرد، بۆ ئەوەی لە کاتی ڕۆیشتن دەنگی بێت و سەرنجی پیاوانی پێ ڕابکێشن. ئێستاش پێڵاو بۆ ئافرەتان بە

پاوانـەکانیان نـەیـەت)، کـە بزانـرێ خشـڵ دارو ڕازاوەن بگەڕێنەوە بۆ لای خـودا، ئەی گـەلی بـڕواداران ! بـە شـکو گشتو ڕزگار ببن﴿٣١﴾ النور﴾

دەربارەی ئـەوەی، کـە ئافرەت بـۆی هـەیـە دەمو چـاوو دەسـتەکانی دانەپۆشێ، ڕاڤـەکار (مفسـر)ان: ئیـبن کـەثیـرو ڕازیو قورتـوبیو تەبـەریو ئالوسـی لـە تەفسـیرەکەیانـداو (زمخشـری) لـە (الکشـاف)و ئیمـام (جصـاص) لـە (احکـام القـران)و سـەیـد قوتـب لـە (فـي ظـلال القـرآن) لـە ڕاڤـەو لێکدانـەوەی ئایـەتی ﴿إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾... مەگـەر ئـەوەی دەرکـەوێ)، ڕایـان وایـە دەسـتو دەم و چـاوە کـە دانەپۆشرێ. جمهوری فوقەهاش ڕایان وایە، کە جەستەی ئافرەت هەموی عەورەتە، نابێ ببینرێ، جگە لە دەم و چاو

---

جۆرێـک دروسـت دەکـەن، کـە دەنگـی تەقـە تـەقی بێـت و لـە دورەوە پیاوان بزانن ئافرەتە، تا چاوچنۆکان و خـوا نەناسان، بـە چاوە ژەهراویەکانیان تەماشای بکەن و نیازی خراپی لێ بکرێ.
لەبەرئـەوە ئایـەتی (ولا یضـربن بـأرجلهن) ئـەم پێڵاوانـەی ئافرەتـان دەگرێتەوە، کە دەبێ ئافرەتی بڕوادار خۆی لێ دور بگرێو لـە پێ ی نەکات.

دەستەکانی، کە دروستە بۆ بێگانە بەدەربخرێ و دانەپۆشرێ. لەپێش هەموانیشەوە ئیبن عەبباس‌و (عطاء) ڕایان وایە، کە (إِلَّا مَا ظَهَـرَ مِنْهَا) دەست‌و دەم و چاوە.

شتێک هەیە مایەی سەرنجە، کە پێویستە ئاماژەی پێ بکەم، ئەویش ئەوەیە، کە هەندێک ئافرەت دەست کێش لە دەست دەکەن، بەڵام ڕوخساریان وەدەردەخەن. ئەم دیاردەیە شتێکی سەیرە، چونکە ئەگەر دەست عەورەت بێ‌و دەبێ داپۆشرێ، ئەوا دەبێ ڕوخساریش عەورەت بێ‌و داپۆشرێ، کە هەندێ زانا ڕایان وایە. جا دەست داپۆشرێ و دەم و چاو دانەپۆشرێ، ئەمەیان هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیەو، بەرهەمی نەفس و ئارەزوی ئافرەتەکەیە کە بیدعەیەکە بۆ دینی هێناوە کە هەمو بیدعەیەکیش گومڕاییە.

دیارە ڕوپۆشی لە سەردەمی پێغەمبەر هەبوە، بەڵام ڕۆژێک لە ڕۆژان پێغەمبەر بە واجبی دانەناوەو خەڵکی ناچار نەکردوە ڕویان بپۆشن، هەروا نکوڵی لە ڕوپۆشیش نەکردوە. نیقاب

## مەرجی دوەم: پۆشاکەکە، نابێ لە خودی خۆید ڕازاوە و سەرنج ڕاکێش بێت.

خــوای گــەورە لــە ســورەتی (نــور) لــە ئایــەتی (٣١) دەفــەرموێ (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ .... جــوانی و ڕازاوەیــی خۆیان دەرنەخەن). ئەم ئایەتە گشت جوانی و ڕازاوەیەک دەگرێتــەوە، لەوانــەش ئــەو پۆشــاک و جــل و بەرگانــە دەگرێتەوە، کە بە هۆی ڕازاندنەوە و زۆر جوان کردنیان ، سەرنجی پیاوانی پێ ڕادەکێشرێ.دیارە ناچێتە عەقڵەوە، خــوای گــەورە فــەرمان بــە بــەدیار نەخستنی ڕازاوەیــی و جــوانکردن بــۆ پیــاوی بێگانــە بــدات، کــەچی ئــافرەت بــە جوانکاری و ڕازاوەییەکی تر خۆی دابپۆشێ.

ئــەو ڕازاندنەوانــەش بــریتین لــە نەخشــاندنی نــەقش و نیگــار لەســەر پۆشــاکەکە، یــان ڕەنــگ کردنــی پۆشــاک بــە چەنــد ڕەنگێکــی ئــاڵ و واڵا و گەشــی ســەرنج ڕاکــێش، کــە بەو (زینە)یە دادەنرێ، کە خوا فەرمانی بە دیار نەخستنی داوە، کاتێ لە ماڵ دەچێتە دەرەوە.

ئافرەتێکی تازە بـوک چـوە لای خـاتو عائیشـەی دایکی بڕواداران، کە سەرپۆشێکی (قبطی) ڕەنگاو ڕەنگی پۆشیبو، خاتو عائیشە گوتی: **لم تؤمن بسـورة (النـور) امـراة تلبس هذا**... ئەو ئافرەتەی ئەم جۆرە سەرپۆشە بپۆشێ، بڕوای بە سورەتی (نور) نیە) تفسیر القرطبی (١٤/٢٤٤).

دیارە ئافرەتانی ئەمڕۆ لە پۆشینی ئـەم جۆرە سەرپۆشـە بێبەش نین، سەرپۆشەکانیان بە نـەخش و نیگارو جۆرەها ڕەنگ ڕازاوەتەوە، کە لە ڕاستیدا ئافرەتەکە جوانتر دەکات و سەرنج ڕاکێشـەری پیاوان دەبێت، ئەمەش بـە (تبـرج) دادەنرێ ، کە خوا قەدەغە (نهی)ی لێکردوە.

(تبـرج)یـش بریتیـە لـە دەرخسـتنی جـوانی و ڕازاوەیـی ئافرەت بۆ پیاوی بێگانە.

هەروەها گوتراوە: بریتییە لە هەمو جوانیو ڕازاوەییەک، کە ئافرەت بیـەوێ بـەدەری خـات، بۆ ئـەوەی لەبـەرچاوی پیاوی بێگانە بە جوانی بێتە بەرچاو، تەنانەت ئـەو پۆشـاکە، کـە ئافرەت بـە ڕازاوەیـیو بـاقو بریـقو، چەنـدەها شـێوەی سەرنج ڕاکێش دەپۆشن، بۆ ئەوەیە ئەو پیاوەی تەماشای

دەکات چێژ لە تەماشا کردنەکەی وەربگرێ[1]

(مقاتل بن حيان) گوتویەتی (تبرج) ئەوەیە ئافرەت سەرپۆش دەپۆشێ، بەلام لە مل و گەردنی نابەستێ و، گەردن و گوارە و ملوانکەکەی وەدەردەکەوێ[2]

لە بنەڕەتدا سەرپۆش دەبێ سەرو سینگ و بەرۆک داپۆشێ و بەسەریدا بهێنرێتە خوارەوە، نەک بە پشت دا بەربدرێتەوە و، گەردەن و سینگ و بەرۆک بە زەقی دەربکەوێ، وەک زۆر لە ئافرەتی ئێستا پیادەی دەکەن‌و خۆیان وا نمایش دەکەن. خوای گەورە دەفەرموێ: (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ....با بەسەر پۆشەکانیان سینگ و بەرۆکیان داپۆشن) النور: ٣١ نەیفەرموە بەسەرپۆشەکانیان پشتیان داپۆشن

(محمد بن أحمد الأنصاری القرطبی) دەڵێ: هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوە بو، کە ئافرەتانی ئەو دەمە،

---

[1] الحجاب للمودودی ص١٣٢

[2] تفسيرابن كثير،ج٣، ص٤٨٢- ٤٨٣،(تفسيرالآلوسي، ج٢١، ص٧- ٨.

ئەگەر سەریان بپۆشیبایە، ئەوا سەر پۆشەکەیان بە پشتیانەوە بەردەدایەوە.

(نەقاش) دەڵێ: وەک (نبط)یەکان سینگو ملو گوێیان دیار بو، جا خوای گەورە فەرمانی توند کردنی سەرپۆشەکانیانی کرد، کە بەسەر یەخەو سینگدا دابدرێو بیپۆشێ) [1]

لەبەرئەوە بە پێی ئایەتەکە، سەرپۆش دادانەوە بە سەر سینگ و بەرۆک (واجبە) و فەرمانی خوایە، کە زۆر لە ئافرەتان بە هەڵە لە مانای سەرپۆش حاڵی بون، وا دەزانن دەبێ تەنها سەر دابپۆشرێ، جا سینگی دەردەکەوێ، یان گەردنی دەردەکەوێ بەلایەوە گرنگ نیە.

بەلام ئەمە سەرپێچی کردنی فەرمانی خوایە و گوناهێکی گەورەیە، دەبێ ئافرەتی مسوڵمان خۆی لێبەدور بخات و بەرفەرمانی بڕیاری خوا بێت

خوای گەورە لە بارەی (تبرج)ەوە دەفەرموێ: وَلَا

---

[1] تفسير (الجامع لأحكام القران)، ج١٢، ص٢٣٠

تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ...وەک دەمانی پێشو جوانیو ڕازاوەیی خۆتان وەدەر مەخەن) ﴿٣٣﴾ الأحزاب.

(تبرج) لە گوناهە گەورەکانە، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی (**ثلاثة لا تسأل عنهم: رجل فارق الجماعة وعصى إمامه ومات عاصياً، وأمة أو عبد أبق من سيده فمات، وامرأة غاب عنها زوجها وقد كفاها مؤنة الدنيا فتبرجت بعده، فلا تسأل عنهم**... سێ کەس هەن پرسیار دەربارەیان مەکە (لەبەرئەوەی لەو کەسانەن، کە بە هیلاک چون) (١) پیاوێک لە کۆمەڵی مسوڵمانان جیابوبێتەوەو، لە پێشەواکەی یاخی ببێ و بە یاخی بونەوە مرد بێ، هەروا ئافرەتێکی کۆیلە، یان پیاوێکی (ج) کۆیلە لە لای گەورەکەی هەڵاتبێ، بێ ئەوەی ئازادی کردبێو ئینجا مردبێ، (ب) ئافرەتێکیش مێردەکەی لە ماڵ نەبێو دەرچوبێو بژێوی بۆ دابین کردبێ، جا ژنەکەی لە دوای ئەودا، جوانیو ڕازاوەیی خۆی بۆ پیاوی بێگانە دەرخستبێ.. جا ئەوانە هەر لێیان مەپرسە) رواه البخاري في الأدب المفرد والحاكم و غيرهما (صحيح الجامع).

(هەروەها ئیمام (ذهبی) لە کتێبەکەی (الکبائر)دا (تبرج)ی بە گوناهە گەورەکانی داناوەو پێناسەی دەکات و دەڵێ: بریتییە لەوەی، گەر ئافرەت ویستی بچێتە دەرەوە، جوانترین‌و ڕازاوەترین پۆشاک بپۆشێ‌و خۆی جوان‌و ڕازاوە بکات، کە بەهۆی ئەوەوە خەڵک توشی فیتنەو خراپەکاری‌و گوناه ببن. جا ئەگەر ئافرەتەکە خۆی توشی گوناه نەبێت، خۆ خەڵک بەهۆیەوە توشی گوناهو خراپەکاری دەبن).(١)

(هەروەها لە هەمان کتێب لە لاپەڕە (١٣١) دا دەڵێ: لەو کردەوانەی ئافرەت توشی نەفرەت (لعنة) دەبێ، بەدیار خستنی جوانی‌و ڕازاوەیی و زێڕو مرواری‌و، خۆ بۆن خۆشکردنە بە میسک و عەنبەر، کاتێ دەچێتە دەرەوە، هەروەها پۆشینی پۆشاکی ڕەنگاوڕەنگ و ئاڵ و واڵا، کە هەمو ئەمانە بە (تبرج) دادەنرێ، با ئەم جۆرە پۆشاکەش هەمو جەستەی داپۆشێ و درێژ بێت، کە خوای گەورە تورە دەکات، لە دنیا و ئاخیرەتیش توشی تورە بون دێت.

---

[1] سلسلة كتاب الطريق الى الجنة (٨،٧)

لـه راسـتیدا ئیسـلام هۆشـداری زۆری داوەو داکـۆکی لەسـەر دەرنەخستنی جـوانیو ڕازاوەیـی ئافرەتـان دەکـات، بـەجۆرێک لـەگـەڵ شـیرک و زینـاو دزی کـردن و شـتە حەرامـەکانی تـر ڕیزبەنـدی کـردووەو نـاوی هێنـاوە. ئـەوەتا پێغەمبەرﷺ پەیمان لە ئافرەتان وەردەگرێت، کە حـەوت کـاری حـەرام نەکـەن، یـەک لەوانـە دەرخسـتنی جـوانیو ڕازاوەیـی ئافرەتانـە. عبداللـە ی کـوڕی عـەمر گـوتی: ئومەیمەی کچی رقیقە چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەسـەر ئیسـلام پـەیمانی بـداتێ، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ((أبايعك على أن لا تشركي بـالله شـيئاً، ولا تسـرقي، ولا تزني، ولا تقتلي ولدك، ولا تأتي ببهتـان تفترينـه بين يديكِ ورجليـك، ولا تنـوحي ولا تتبرجـي تبـرج الجاهلية الأولى...: پەیمانت لێ وەردەگرم، کە هاوبەش بۆ خوا بڕیار نەدەیت(١)، دزی نەکەیت(٢)، منداڵەکەت نەکوژی(٣)، بوختان نەکەیت(٤)، شینو ڕۆڕۆ نـەکـەیتو بەسـەر مـردوودا هـەڵنـەڵێیـت(٥)، جـوانیو رازاوەیـی خـۆت وەک ئافرەتـانی سەردەمی نەفامی بۆ پیاوی بێگانە وەدەر نەخەیت(٦).))

سەبارەت بە رەنگی بالاپۆشیی، ئافرەت بۆی دروستە و بە زینە دانانرێت، گەر پۆشاکەکەی جگە لە ڕەنگی سپی و ڕەش بێت، واتا تۆخ بێت. هەروەک هاوسەرەکانی پێغەمبەر بەو شێوەیە پۆشیویانە. جا لەم بارەوە هەندێک شوێنەوار (آثار) وەک بەڵگە دەهێنینەوە، کە (حافظ ابن أبی شیبە) لە (المصنف) (٨/٣٧١-٣٧٢)دا گێڕاویەتەوە:

١- ئیبراهیمی نەخەعی گوتویەتی: (**أنه كان يدخل مع علقمة والأسود على أزواج النبيﷺ، فيراهن في اللحف الحمر**... لەگەڵ عەلقەمە و ئەسوەد دەچونە ماڵی هاوسەرەکانی پێغەمبەر، بینیویانە، کە پۆشاکی سوریان لە خۆ وەرپێچاوە).

٢- (ابن ابی ملیکە) گوتویەتی (**رأيت على أم سلمة درعاً وملحفة مصبغتين بالعصفر**... ئوم سەلەمەم بینی پۆشاکو چارشێوێکی پۆشیبو، کە رەنگی سور بو).

٣- قاسمی کوڕی محمدی کوڕی ئەبو بەکری سدیق گوتویەتی: (**أن عائشة كانت تلبس الثياب المعصفرة، وهي مُحْرِمة**..خاتو عائیشە پۆشاکی سوری پۆشیوە، لە کاتێکدا لە ئیحرام دابوە).

٤- له سه‌عیدی کوڕی جوبه‌یره‌وه: (أنه رأى بعض أزواج النبي ﷺ تطوف بالبيت و عليها ثياب معصفرة... که‌وا هه‌ندێ له هاوسه‌ری پێغه‌مبه‌ری دیتوه، که به ده‌وری که‌عبه‌دا ته‌وافیان ده‌کرد، پۆشاکی سوریان له‌به‌ربوه.[1]

## مه‌رجی سێیه‌م: پۆشاکه‌که، ده‌بێ ئه‌ستور بێت و ته‌نک نه‌بێت، که جه‌سته‌ی تێدا ده‌رکه‌وێ.

ئه‌و جل و به‌رگ و پۆشاکه‌ی ئافره‌ت ده‌یپۆشێ، ده‌بێ ئه‌ستور بێت، تا پێستی له‌شی ده‌رنه‌که‌وێ. دیاره جلی ته‌نک زۆر سه‌رنج راکێشه‌ره و پیاوان بۆ گوناهان که‌مه‌ند کێش ده‌کات و، ئافره‌ته‌که‌ش وه‌به‌ر هه‌ڕه‌شه‌و نه‌فره‌ت (لعنه)ی پێغه‌مبه‌ر ده‌که‌وێت، وه‌ک ده‌فه‌رموێ: (سيكون في آخر امتي نساء كاسيات عاريات، على رؤسهن كأسنمة البُخت، إلعنوهن فإنهم ملعونات... له کۆتایی ئوممه‌تم، ئافره‌تانێک په‌یدا ده‌بن، که پۆشته‌ن و پۆشاکیان

---

[1] جلباب المرأة المسلمة، ص ١٢٢- ١٢٣.

لەبەرە، بەڵام لە ڕاستیدا ڕوتن، وەک کۆپاڵی حوشتر قژیان لەسەر سەریان تۆپەڵە دەکەن[1]، جا ئێوە نەفرەتیان لێ بکەن، چونکە ئەوانە نەفرەتیان لێکراوە) أخرجه الطبرانی فی (المعجم الصغير)، ص٢٣٢ وصححه الألبانی فی الحجاب، ص٥٦.

(ابن عبدالبر) دەربارەی مانای (کاسیات عاریات) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەو ئافرەتانەیە، کە جلی تەنک لەبەر دەکەن، کە لەشیان دەردەخات و دایناپۆشێ. ئا ئەو ئافرەتانە بە ناو پۆشاکیان پۆشیوە، بەڵام لە ڕاستیشدا ڕوتن)[2]

هەروەها لە فەرمودەیەکی تردا فەرمویەتی: (**صنفان من أهل النار لم أرَهما، قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس، ونساء كاسيات عاريات**

---

[1] لەناو ئافرەتان باوەو دەڵێن فلان ئافرەت قژی کردۆتە تەماتە، جا ئەوانە لەسەر سەریان کۆی دەکەنەوە، یان لە پشتی سەریانەوە تۆپەڵی دەکەن. نابێ ئافرەت لەژێر سەرپۆشەکەیەوە بەو شێوەیە تۆپەڵی بکات، کە لە سەر سەری زەق دیار بکەوێ، یان لە پشتی سەریەوە دەربکەوێ.

[2] سیوطي لە کتێبي (تنوير الحوالک)، (١٠٣/٣) نەقلي کردوە.

ممیلات مائلات رؤوسهن كأسـنمة البخـت المائلـة، لا یدخُلْن الجنة ولا یجدن ریحها وإن ریحها لیوجد مـن مسیرة كـذا وكـذا... دو پۆل و چین لە خـەڵكی دۆزەخ هەن، كە نەم دیتون: كۆمـەڵێک قامچیان بە دەستەوەیە، كە لـە خـەڵكی دەدەن. پۆلی دووەم: ئافرەتانێكن پۆشتەن‌و ڕوتـن، بەلەنجـەو لارو فیـزەوە دەڕۆن، كـە سـەرنجی پیـاوان بۆ خۆیان ڕادەكێشن.قژیان وەک كۆپـاڵی حوشـتر لەسـەر سەریان تۆپـەڵ دەن‌و لاری دەكەنـەوە، جـا ئـەو ئافرەتانـەی بەوشێوەن، ناچنە بەهەشت‌و بۆنی بەهەشتیش ناكـەن، كە بـە هەشـت لـەماوەی ئەوەنـدەو ئەوەنـدەوە بـۆنی دەكـرێ) صحیح مسلم بشرح النووی، ج١٤، ص١٩-١١٠.

(هـەر سـەبارەت بـە واتـای (كاسیات عاریات) دەكـرێ بڵێین: ئەو ئافرەتانەن، كە جلی تـەنک لەبـەر دەكـەن، كە ژێـرەوەی جلەكـەی بـەدەردەخات و ڕەنگـی پێسـتیان بـە دەردەخات.یان ئەو ئافرەتانـەن هەنـدێ لەشیان دادەپۆشـن و هەندێكی تریش بە دەردەخەن، یان هەندێک لەشیان بە جلـی كـورت‌و تـەنک دادەپۆشــن ، كــە پێســتیان بــە دەردەخات، تەنانەت ئەندامی لەشیشیان.

هەروەک ئێستا دەبینین ئافرەتان پۆشاکی تەنک و نەرمو شل و تەسک لەبەر دەکەن، کە هەندێ لەش دادەپۆشێ، بەڵام ژێرەوەو ئەندامی جەستەی‌و و گەردن و سینگ و باسکەکان بە ڕوتی دەردەخات. ئا ئەوانە وەک پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی پۆشاکیان لەبەرە، بەڵام ڕوتیشن)[1] [illegible]

بۆ پشتگیری‌و بەهێزکردنی بابەتەکەمان، فەرمودەیەکی تری پێغەمبەر دێنینەوە، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نابێ پۆشاکی ئافرەت تەنک بێت، وەک خاتو عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتویەتی: (**أن أسماء بنت أبي بكر دخلت على رسول الله ﷺ وعليها ثياب رقاق، فأعرض عنها وقال: يا أسماء! إن المرأة إذا بلغت المحيض لم يصلح لها أن يُرى منها إلاّ هذا وهذا، وأشار إلى وجهه و كفّيه**.....ئەسمای کچی ئەبوبەکر هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، کە جلێکی تەنکی لەبەربو، پێغەمبەری خواش پشتی تێ کردو فەرمووی: ئەسما! ئافرەت گەر باڵغ

---

[1] المفصل في أحكام المرأة، ج٣، ص٣٢٣- ٣٣٤

بو خوێنی بێ نوێژی دیت، بۆی دروست نیەو نابێ، جگە لـە هـەردو دەسـتی و ڕوخسـاری هـیچ شـوێنێکی تـری دەرکـەوێ). اخرجـە ابـو داود (سـنن ابـی داود ج١١، ص١٦١).

کەواتـە ئـافرەتی بـڕواداری ڕاستەقینە، لێناگـەڕێ و بـە خۆی ڕەوا نابینێ، جل و پۆشاکی تەنک بێ، کە جەستە و لەشـی دەرکـەوێ. هـەردەم هـەوڵ دەدات کـام پۆشـاک مایەی ڕەزامەندی خوا و پێغەمبـەرە، ئـەویان بپۆشێ، هـیچ کاتێ چاولێکـەری و لۆمـەی لۆمـەکاران کـاری تـێ ناکات. هەروا خۆی دەپارێزێ، کـە وەبـەر هـەڕەشـەی ئـەو (لعنـه) لێدانـە نەکـەوێ، کـە بـۆ ئـەو جـۆرە ئافرەتانـەیە، کـە جـل‌و پۆشـاکیان تەنکـە. دیـارە نـەفرەت (لعنـه)یـش لـە کارێـک دەکرێ، کە گوناهەکەی گەورە بێت. جا خـۆ پاراسـتن لـەو لەعنەتە، سەرفرازیی دنیاو قیامەتە، چونکە لەعنەت، مانای بـێبـەش بونـە لـە بـەزەیـی‌و میهـری خـوا. ئـەو کەسـەش بێبەش بێ لە بەزەیی خوا، ئاگری دۆزەخی بۆ مسۆگەرە، پەنا بە خوا.

## مەرجى چوارەم: پۆشاكەكە، دەبێ پان و فراوان بێت و، تەسک نەبێت.

پۆشاک و جلى فراوان بۆ ئەوەیە، تا شوێنە سەرنج ڕاكێشەرەكانى ئافرەت بشارێتەوەو، ئەندامە هەستیارەكانى دابپۆشێ، كە وروژێنەرى ئارەزوى پیاوانە. دیاریشە جلى تەسک بەلەشەوە دەنوسێو ئەندامەكانى بەزەقى دەردەخات.

ئوسامەى كوڕى زەید گوتویەتى: ((**كساني رسول الله ﷺ قبطية كثيفة مما أهداها له دحية الكلبي فكسوتها إمرأتي، فقال: مالك لم تلبس القبطية؟ قلت كسوتها إمرأتي، فقال: مرها فلتجعل تحتها غلالة فإني أخاف أن تصف حجم عظامها**... پێغەمبەرى خوا پۆشاكێكى (قبطى) ئەستورى پێ بەخشیم، كە دوحیەى كەلبى كردبویە دیارى، منیش بەخشیمە خێزانەكەم لەبەرى بكات، پێغەمبەر فەرموى: بۆچى پۆشاكە (قبطى)یەكەت لەبەر نەكرد، گوتم: داومە بە خێزانەكەم لەبەرى بكات. پێغەمبەر فەرموى پێى بڵێ، با ژێر

کراسێکی لەگەڵ لەبەر بکات، چونکە دەترسم قەبارەی ئێسکی (ئەندامی لەشی) دەربخات)) أخرجه الضياء المقدسي في (الأحاديث المختارة) (٤٤١/١) و أحمد و البيهقي، بسند حسن، وله شاهد من حديث دحية نفسه، أخرجه أبو داود والبيهقي والحاكم، وصححه.

لەبەر ئەوە بە هیچ شێوەیەک دروست (جائیز)نیە، ئافرەت جلی تەسک لەبەر بکات، وەک ئافرەت ئاسای ئێستا، کە تەنورەیەکی تەسک و بلوزێک یان جبەیەکی تەسک، دەپۆشێ، کە ئەندامە هەستیارەکانی بە زەقی دەردەخات و سەرپۆشەکەی بە پشتیەوە دادەداتەوە، تا سینگ و بەرۆکی بە زەقی نمایش بکات.

سەبارەت بە تەسکیەوە، پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە دەبێ سەرقۆڵی جلی ئافرەت تەسک بێت، بۆ ئەوەی کاتێک دەستی بەرز دەکاتەوە، باسکو بن هەنگلی دەرنەکەوێ. دەشکرێ قۆڵی فراوان کات، بەڵام لە ژێرەوە شتێک لەبەر بکات.

## مەرجی پێنجەم: پۆشاکەکە، نابێ بۆندار بکرێ.

هەڵبەت بۆن و عەتر، کاریگەریەکی گەورەی لەسەر دەرون و دڵڕاکێشان هەیە، بە تایبەتی گەر ئافرەت خۆی بۆندار بکات، ئەوا کاریگەریەکەی زۆرترە و، پیاوان سەرنج ڕاکێش دەکات. لەبەرئەوە کاتێ ئافرەت لە ماڵ دەچێتە دەرەوە، نابێ خۆی بۆندار بکات بە جۆرێک پیاوان هەست بە بۆنەکەی بکەن.

جا لەم بارەوە چەندەها فەرمودەی پێغەمبەر هاتوە، کە ڕێگری لە ئافرەتان دەکەن، کە خۆیان و پۆشاکیان بۆندار بکەن، لەوانە:

١- ئەبو موسای ئەشعەری گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی (**أيما امرأة استعطرت فمرت على قوم ليجدوا من ريحها؛ فهي** زانية... هەر ئافرەتێک خۆی بۆندار بکات و بە لای کۆمەڵە پیاوێک دا بڕوات، تا بۆنی بکەن، ئەوا ئەو ئافرەتە زینای کردوە) رواه ابو داود[1]

---

[1] أخرجه النسائي (٢/٢٨٣) وكذا ابو داود (٢/١٩٢) والترمذي (٤/١٧) بشرح المباركفوري والحاكم (٢/٣٩٦) واحمد (٤و٤١٣) وابن خزيمة

٢- ئەبو سەعید گوتویەتی: پێغەمبەر فەرمویەتی (كل عين زانية، والمرأة إذا استعطرت فمرت بالمجلس فهي كذا كذا، يعني زانية) أخرجه الترمذى.

بۆ لێكدانەوە و شەرحی ئەم فەرمودەیە، لە كتێبی (تحفة الأحوذى بشرح جامع الترمذى ج٨ ص٧٠-٧١) دا هاتوە: واتە: هەمو چاوێك بە مەبەستی ئارەزوەوە تەماشای ئافرەتێكی بێگانە بكات، ئەوا ئەو چاوە زینای كردوە، ئافرەتیش گەر خۆی بۆندار كردو بە كۆڕو مەجلیسی پیاوان تێپەڕی، ئەوا زینای كردوە، چونكە بەخۆ بۆندار كردنی ئارەزوی پیاوان دەبزوێنێو بۆتە هۆی ئەوەی تەماشای بكەن، هەر كەسێك تەماشای ئافرەتی بێگانە بكات، ئەوا بە چاوی زینای كردوە، جا ئافرەتەكە هۆكاری زینای چاوە، لەبەر ئەم هۆیە گوناهبار دەبێت[1]

٣- زەینەبی سەقەفی گوتویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١٦٨١/٩١/٣) وابن حبان (١٤٧٤- موارد) وقال الترمذي: (حسن صحيح) والحاكم: (صحيح الاسناد) وافقه الذهبي وقال الألباني إسناده حسن.

[1] المفصل في أحكام المرأة - د.عبدالكريم زيدان، ج٣، ص٣٦٧

فەرمویەتی. (إذا خرجت إحداكن إلى المسجد فلا تقربن طيباً... ئەگەر یەکێک لە ئێوە (ئافرەتان) لەماڵ دەرچون بۆ مزگەوت، نزیک عەتر مەکەون (خۆتان بۆندار مەکەن). رواه مسلم رقم (٤٤٣) في الصلاة ورواه النسائي (١٥٤/٨- ١٥٥ )[1] جا بۆی کارەکە بینالکا عەقە بۆمان سۆر بەلازم

بۆیە نویژی عیشا تایبەت کراوە، چونکە شەو زیاتر هۆکاری فیتنە و خراپەکاریە[2]

شێخ ئەلبانی دەڵێ: گەر خۆ بۆندار کردنی ئافرەت بۆ چونە مزگەوت یاساغ و حەرام بێت، ئەدی حوکمی ئەوە چیە، کە بە بۆنداریەوە دەچنە بازاڕ و شەقام و کۆڵانەکان؟ بێگومان حەرامیەکەی توندترەو، گوناهەکەشی گەورەترە. هەیتەمی لە کتێبی (الزواجر) ٣٧/٢ گوتویەتی: دەرچونی ئافرەت لە ماڵەکەی بە بۆنداری و خۆ جوانکردن و ڕازاوەیی، لە گوناهە گەورەکانە، ئەگەر بە مۆڵەتی مێردەکەشی بێت[3].

---

[1] أدلة الحجاب د.محمد بن أحمد بن أسماعيل المقدم، ص١٦١.
[2] المفصل في أحكام المرأة، ج٣، ص٣٦٧
[3] جلباب المرأة المسلمة ص١٣٩

سەبارەت بە بەکارهێنانی بۆن بۆ ئافرەتان، کاتێ لە ماڵ دەچێتە دەرەوە، پێویستە هەڵوەستەیەک بکەین و زۆر گرنگیشە بە پوختی لەسەری بدوێین:

مەسەلەی بەکار هێنان و بەکارنەهێنانی بۆن و عەتر بۆ ئافرەتان، کاتێ لە ماڵ دەچێتە دەرەوە، وەک مەسەلەی درێژ کردنی پانتۆڵ و شەرواڵ بە هۆ (**علّة**)ەوە پەیوەستە. بۆ نمونە: کاتێ پێغەمبەر دەفەرموێ: **ما أسفل الكعبين من الأزار ففي النار**... ئەو کەسەی پانتۆڵەکەی یان شەرواڵەکەی لە خوار گوزینگەوە بێت، ئەوا لە ئاگری دۆزەخە)[1] بەڵام لە فەرمودەیەکی تردا هۆ (**علّة**)ە کە دیار دەکات، کە گەر بەمەبەستی فیز و لوتبەرزی وشانازی کردنەوە پانتۆڵ و شەرواڵە درێژ بکرێت، هەڕەشەکە دەیگرێتەوە. ئەوەتا دەفەرموێ (**لا ينظر الله إلى من جر ثوبه خيلاء**... خوا تەماشای کەسێک ناکات، کە پۆشاکەکەی بەمەبەستی شانازی و فیزو لە خۆباییەوە

---

[1] صحيح البخاري بشرح العسقلاني، ج، ص ٢٥٦، ورواه النسائي في سننه، ج ٨ ص١٨٣

بە دوای خۆی ڕابکێشێ) [١]

وەک لە فەرمودەکەی پێغەمبەر ئاماژەی بۆ کراوە، کە دەفەرموێ: (**أيما امرأة استعطرت فمّرت على قوم ليجدوا من ريحها؛ فهي زانية**).

شێخ ئەلبانی لە (جلباب المرأة المسلمة) و د.عبدالكريم زيدان لە (مفصل أحكام المرأة)دا دەربارەی ئەم فەرمودەیە دەڵێن. (**بۆیە دروست نیە ئافرەت لە دەرەوەی ماڵ خۆی بۆندار بکات، لەبەرئەوەی بۆنی عەترەکە سەرنجی پیاوان ڕادەکێشێ و ئارەزو (شهوة)یان دەبزوێنێ**).

ئەدی ئەگەر هۆیەکە نەماو، تەنها ئافرەتەکە خۆی هەست بە بۆنەکەی بکات وەک ئەو عەترو بۆ (معطر)انەی لە بازاڕەکان هەنە، کە بە تایبەتی بۆ بن هەنگڵ بەکار دەهێنرێ و بۆنی ناخۆش و ئارەقە دەبڕێ؟ ئەوا دروست (جائيز)ە ئافرەت بۆ دەرەوە بەکاری بێنێ. بەڵام بۆن و عەتری کشمیر و هاوای و ئەمریکانۆ و هاوشێوەی ئەوانە، کە بۆنیان تیژە و لە لایەن پیاوانەوە

---

[١] هەمان سەرچاوە، ص٢٥٢

هەست بە بۆنیان دەکرێ، دروست نیە و نابێ ئافرەت خۆی پێ بۆندار بکات لە دەرەوەی ماڵ.
ئەو جۆرە بۆنانەی باسمان کردن، کە بۆنیان تیژە وەک هاوای و کشمیر زۆر دروستە و دەبێ ئافرەت بۆ مێردەکەی خۆی پێ بۆنخۆش بکات و، سەرنجی مێردەکەی بۆ لای خۆی پێ ڕابکێشێ، کە خۆشەویستی زیاتر دەکات.

## مەرجی شەشەم: پۆشاکەکە، نابێ بە جلی پیاوان بچێت

لەو دیاردانەی لە ناو ئافرەتان بە تایبەتی بۆتە شتێکی باو و ئاسایی؛ لاسایی کردنەوە و لەبەرکردنی جل و بەرگە لە نێوان ئافرەتان و پیاواندا.
جا لەم بارەوە چەندەها فەرمودەی پێغەمبەر هاتوە، کە بەربەستی و ڕێگر (نهی) دەکات:
١- **لعن رسول الله ﷺ الرجل يلبس لبسة المرأة، والمرأة تلبس لبسة الرجل**... پێغەمبەری خوا نەفرەت (لعنە)ی لەو پیاوە کردوە، کە جل و پۆشاکی ئافرەتان

لەبەر دەکات، نەفرەتیشی لەو ئافرەتە کردوە، کە جل و بەرگی پیاوان لەبەر دەکات[1]

٢- عبداللەی کوڕی عومەر گوتویەتی: گوێ بیستی پێغەمبەر بوم، دەیفەرمو: (**لیس منا من تشبه بالرجال من النساء، ولا من تشبه بالنساء من الرجال**... ئەو ئافرەتەی لاسایی پیاوان بکاتەوە و خۆی پێیان بچوێنێ لە ئێمە نیە (مسوڵمان) نیە، هەروا ئەو پیاوەش، کە خۆی بە ئافرەتان بچوێنێ و لاسایان بکاتەوە، لە ئێمە نیە)[2]

٣- ئیبن عەبباس گوتویەتی: (**لعن رسول الله ﷺ المتشبهين من الرجال بالنساء، والمتشبهات من النساء بالرجال**.... پێغەمبەری خوا نەفرەتی لەو پیاوانە کردوە، کە خۆیان بە ئافرەتان دەچوێنن لە جل‌وبەرگ‌و شێوازو ڕەفتاریان، هەروا نەفرەتی لەو ئافرەتانە کردوە، کە

[1] أخرجه ابو داود (١٨٢/٢) وابن ماجه (٥٨٨/١) والحاكم (١٩٤/٤) و احمد (٣٢٥/٢) من طريق سهيل بن أبي صالح عن أبيه عنه. وقال الحاكم صحيح على شرط مسلم.

[2] أخرجه الامام أحمد (١٩٩/٢- ٢٠٠) وأبو نعيم في "الحلية" (٣٢١/٣) وصححه الألباني في (الحجاب)، ص٦٦- ٦٧

لاسای پیاوان دەکەنەوەو، خۆیان پێیان دەچوێنن لە جل و پۆشاک و ڕەفتاریان دا) [1]

٤- ئیبن عەبباس گوتویەتی: (**لعن النبي ﷺ المخنثين من الرجال، والمترجلات من النساء، وقال: أخرجوهم من بيوتكم.قال: فأخرج النبي ﷺ فلانا، وأخرج عمر فلاناً..** پێغەمبەر نەفرەتی لە پیاوە ژنانیەکان کردوە، نەفرەتی لەو ئافرەتانەش کردوە، کە خۆیان وەک پیاوان دەنوێنن.پێغەمبەر فەرموی: ئەو جۆرە کەسانە لەماڵەکانتا دەرکەن. ئیبن عەبباس گوتی: پێغەمبەر فڵانە پیاوی ژنانی لەماڵ دەرکرد، عومەریش فلانە پیاوی ژنانی لە ماڵ دەرکرد.) [2]

٥- عبداللە ی کوڕی عومەر گوتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (**ثلاث لا يدخلون الجنة ولا ينظر الله إليهم يوم القيامة: العاق والديه، المرأة المترجلة**

---

[1] أخرجه الأمام البخاري في صحيحه، ج١٠، ص٣٣٣.

[2] أخرجه البخاري (٢٧٤/١٠) و أبو داود (٣٠٥/٢) والدارمي (٢٨٠/٢-٢٨١) و أحمد (رقم ٩٨٢ و ٢٠٠٦ و ٢١٢٣) من طريق هشام الدستوائي عن يحيى ابن أبي كثير عن عكرمة عنه.

المتشبهة بالرجال، والـديوث... سێ کەس هەن ناچنە بەهەشت و، خـوا لـە ڕۆژی سـەڵا تەماشایان ناکات: ئەو کەسەی دڵی دایکو باوکی ئازار دەداتو لەسەر چاکە سـەرپێچیان دەکـات، ئـەو ئافرەتـەش خـۆی بـە پیـاوان دەچوێنێ و لاسایان دەکاتەوە، ئەو کەسەش غیرەتی نەبێو شەرەفو ناموسی نمایشي خەڵک بکات -گەواد-)[1]

(ئیـبن حەجـەری عەسقەلانی دەربارەی لاسایی و خـۆ چوانـدنی ئافرەتـان و پیـاوان بـە یـەکتری دەڵێ: مەبەست لەو لاساییو خۆ چواندنە حەرامەی نێوانیان، خـۆ چواندنو لاسایی پۆشاکو جلو بـەرگو خـۆ جـوان کـردن و قسەو چۆنیـەتی ڕۆیشـتنە. هـەروەها دەڵـێ: سـەبارەت بـە شێوازو جـۆری پۆشـاک، ئـەوا بـە پـێی داب و نـەریتی هـەر وڵاتێکەوە جیاوازی هەیە چونکە زۆر قەوم هەن، کە جل

---

[1] أخرجه النسائي (٣٥٧/١) والحاكم (٧٢/١ و ١٤٦/٤- ١٤٧) والبيهقي (٢٢٦/١٠) وأحمد (رقم ٦١٨٠) من طريقين صحيحين عن عبدالله بن يسار مولى ابن عمر عن سالم عن ابن عمر به. وقال الحاكم (صحيح الاسناد) وافقه الذهبي.

و بەرگی ژن و پیاویان جیاوازیان نیە، بەڵام ئەوەی، کە ئافرەتانی پێ جیا دەکرێتەوە، خۆ داپۆشین و باڵاپۆشییە) [1]

لە ڕاستیدا ئەم فەرمودانە هەڕەشەی ترسناک و زۆر گەورەن لەسەر دوا ڕۆژ و سەرەنجامی ئەم جۆرە ئافرەتانە، بە تایبەتی و، پیاوان بە گشتی.

ئەوەتا لەم ڕۆژگارەی ئێستا، ئافرەتان پانتۆڵ و کراس، پانتۆڵ بلوزی تەسکو چاکەتو پانتۆڵی بەسەر پۆشێکەوە دەپۆشن بە شێوەیەکی لەخشتەبەر، کە پیاوان شەیدا دەکەن و دڵیان ڕادەکێشن و بەرەو گوناهیان سەرکێش دەکەن، جگە لە گوناهبار کردنی خۆیان. ئا ئەو ئافرەتانە خۆیان وەبەر ئەو لەعنەت و بێ بەریەی پێغەمبەر کردوە، کە لە فەرمودەکان باسکران، با ئەو ئافرەتانە نوێژیش بکەن و ڕۆژوش بگرن.

گەر ئافرەتێک بڕوای تەواوی بە خوای گەورە و پێغەمبەر هەبێت و، لە دینی خوا حاڵی بوبێت، هەرگیز ئەم جۆرە پۆشاکە سەرشۆڕکەر و قێزەونە لەبەر ناکات.

---

[1] شرح صحيح البخاري لابن حجر العسقلاني، ج١٠، ص٣٣٢.

## مەرجی حەوتەم: نابێت بە جل و بەرگی ئافرەتی کافر بچێت

دیارە مسوڵمان بە ئافرەتو پیاوەوە، خاوەن کەسایەتیو جۆری پۆشاک و جلی تایبەتین، تا شەرمگە و عەورەت و خۆیانی پێ پۆشتە بکەن، کە نابێ لاسایی بێ بڕوایان بکرێتەوە لەو جل و بەرگ و داب و نەریتە ناشیرین و قێزەونانەی، کە کەسایەتی مسوڵمان لەکەدار دەکەن.

جا یەک لەو شتانەی ئافرەتان لاسای دەکەنەوە، جل و پۆشاکی ئافرەتانی ڕۆژئاوایە، کە لەسەر ئافرەتی مسوڵمان حەرامە بەکارهێنانی. ئەوەتا ئیبن عومەر گوتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (**من تشبه بقوم فهو منهم**... هەر کەسێک خۆی بە قەومێک بچوێنی، ئەوا ئەو کەسە لەوانە) رواه أبو داود و غیره. خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ... بۆ کەسانی خاوەن باوەڕ، ئاخۆ

ئەو دەمە نەگەییوە، کە دڵیان بۆ یادی خودا و بۆ ئەو ڕاستیەی ناردویەتی، بکورکێنێ و بترسێ و، لەو کەسانە نەبن، کە لە پێشدا ئێمە کتێبمان دابونێ و ئەوسا لە پاش ماوەیەکی زۆر، توشی دڵڕەقی هاتن و زۆربەیان لە ڕێ لایاندا؟ ﴿١٦﴾ الحديد﴾..

(ئیبن کثیر لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا گوتویەتی: لەبەر ئەمەیە، خوا ڕێگری لە بڕواداران کردوە، کە بە کاروبارە بنەڕەتی و نابنەڕەتیەکانیان، خۆیان پێ بچوێنن و لاسایان بکەنەوە.

ئیبن تەیمیەش گوتویەتی: خوای گەورە، کە لەم ئایەتە دەفەرموێ: (ولا یکونوا... لەو کەسانە نەبن) ئەمە ڕێگر (نهی)یەکی ڕەها (مطلق)ە لە لاساکردنەوە و خۆ پێ چواندنیان هەروەها تایبەتە بە بەربەستی و نەهی لە خۆچواندن و لاسا کردنەوەیان لە دڵڕەقیاندا، دڵڕەقیش لەبەرهەمی گوناهو سەرپێچیە)[1]

---

[1] جلباب المرأة المسلمة - للشيخ الألباني.

بێگومان خۆ چواندن و لاساکردنەوە، جل و پۆشاکیش دەگرێتەوە.ئەوەتا عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص گوتویەتی: (رأى رسول الله ﷺ علي ثوبين معصفرين، فقال: إن هذه من ثياب الكفار فلا تلبسها... پێغەمبەری خوا بینی دو پۆشاکی سورم لەبەرە، جا فەرموی: ئەم پۆشاکە هی کافرانە لەبەری مەکە) صحيح مسلم.

## مەرجی هەشتەم: پۆشاکەکە، نابێ بۆناو و شۆرەت و فیز کردنەوە بێت.

یەکێک لە سیفەتە جوانەکانی مسولمان بە ژن و پیاوەوە ئەوەیە، کە فیزو شانازی بەسەر خەڵکیدا ناکات و خۆی لێیان جیاناکاتەوە و، خۆی بە گەورەتر نازانێ. بەڵام کاتێ شەیتان بەسەر دڵیدا زاڵ دەبێت و لە خشتەی دەبات‌و خۆشەویستی دنیا بەسەریدا زاڵ دەبێ، ڕاستەقینەو ماهیەتی خۆی لە بیر دەکات، حەز دەکات جل‌و پۆشاکێک لەبەر بکات، کە شانازی پێوە بکات‌و فیزو پۆزی

پێ لێ بدات، پۆشینی پۆشاکیش بەم نیازەوە، خاوەنەکەی بەرەو ئاگری دۆزەخ سەرکێش دەکات.

ئیبن عومەر گوتویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (**من لبس ثوب شهرة في الدنيا ألبسه الله ثوب مذلة يوم القيامة، ثم ألهب فيه ناراً**... هەر کەسێک جل و پۆشاکێک بۆ ناو شۆرەت و ناوبانگی لەبەر بکات، خوای گەورە لە ڕۆژی سەڵا، پۆشاکی ڕیسوایی و زەبونی لەبەر دەکات و، پاشان ئاگری تێبەر دەدات). اخرجه ابو داود (١٧٢/٢) وابن ماجه (٢٧٨/٢- ٢٧٩) اسناده حسن.

(دیارە پۆشاکی ناو شۆرەت، گشت ئەو جل و پۆشاکە دەگرێتەوە، کە مەبەست پێی لە نێو خەڵکیدا، ناوی پێ دەربکرێ، جا ئەو پۆشاکە گرانبەها بێت، کە شانازی پێ بکرێت، یان پۆشاکەکە کەم بەها بێت و بۆ دەرخستنی زوهد و ڕیایی بێت.

شەوکانی لە (نیل الأوطار) ٩٤/٢ گوتویەتی: (ابن الأثير) دەڵێ: الشهير ظهور الشئ، والمراد أن ثوبه يشتهر بين الناس لمخالفة لونه لألوان ثيابهم، فيرفع الناس إليه

أبصارهم، ويختال عليهم بالعجب والتكبر... ناوبانگی و ناوو شۆرەت بریتیە لە دەرخستنی شت، مەبەست ئەوەبێ، کە پۆشاکەکە لەبەر جیاوازی ڕەنگەکەی لە ڕەنگی پۆشاکی خەڵکی، ناوو شۆرەت لە نێو خەڵکی دەرکات و، خەڵک تەماشای بکەن، ئەویش بە فیزو لوتبەرزی و سەرسامیەوە شانازیان بەسەردا بکات)[1]

بەڵام ئەوەی شایانی ئاماژە پێکردنە ئەوەیە، کە پێویستە جیاوازی بکرێ لە نێوان ئەو جل و پۆشاکەی بۆ فیزو شانازی لەبەردەکرێ، کە حەرامە، هەروا لەنێوان ئەو جلو پۆشاکەی بە مەبەستی جوانیو پۆشتەییو ڕێکو پێکی لەبەردەکرێو شانازی پێوناکرێ، کە دروستەو حەڵاڵە.

ئیبن مەسعود گوتویەتی: پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: **(لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبرٍ، فقال رجل إن الرجل يحب أن يكون ثوبه حسناً، ونعله حسناً، قال ﷺ: إن الله جميل يحب الجمال،**

---

[1] جلباب المرأة المسلمة – للألباني، ص٢١٣.

الكِبر بطَرُ الحقِّ وغمط الناس... کەسێک تۆزقاڵێک خۆ بەگەورەزانی لە دڵدا بێت، ناچێتە بەهەشت. پیاوێک گوتی: پیاو هەیە حەز دەکات جل و پۆشاکی باش‌و جوان و ڕێک و پێک بێت، پێڵاوەکەی جوان‌و باش بێت. پێغەمبەر فەرموی: خوا جوانەو جوانی خۆش دەوێت. خۆ بەگەورەزانی و لوت بەرزیی، بریتیە لە حەق نەسەلماندن و بە سوک سەیر کردنی خەڵکی)[1]

ئیبن تەیمیە لە (مجموع الفتاوى) گوتویەتی: (من لبس جميل الثياب إظهارا لنعمة الله، أو استعانة على طاعة الله كان مأجورا... هەرکەسێک پۆشاکی جوان لەبەر بکات، بۆ ئەوەی نیعمەت و بەهرەی خوا بەدەربخات، یان بەهۆیەوە بەر فەرمانی خوای پێ بکات؛ ئەوا پاداشتی لەسەر وەردەگرێت.

دەشکرێ پۆشاک و جلێک لەبەر بکرێت، کە گران بەها بێت، بەڵام بە مەرجی دڵنیا بون لە لوت بەرزی و

---

[1] رواه أحمد ومسلم، بڕوانە (نيل الأوطار)ي شەوكاني بەرگی دو، ل١١٠.

شانازی نەکردن بەسەر خەڵکی، هەروا شوێنەواری نیعمەتی خوای لەسەر ڕەنگ بداتەوەو، باسی نیعمەتی خوا لەسەر خۆی بکات ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ۝١١﴾ الضحی پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی. (**إن الله يحب أن يرى أثر نعمته على عبده**... خوا حەز دەکات شوێنەواری نیعمەتەکەی لەسەر بەندەی خۆی ببینرێ)[1]

هەروا ئەبی ئەحوەص لە مالکی کوڕی نەچلەی باوکیەوە دەگێڕێتەوە، کە گوتویەتی: (**أتيت رسول الله وعليَّ ثوب دون فقال لي: "ألك مال"؟ قلت : نعم، قال : "من أيِّ المال" ؟ قلت: من كل المال قد أعطاني الله: من الابل والبقر والغنم والخيل والرقيق قال : "فاذا آتاك الله مالاً فَلْيُر أثَرُ نعمة الله عليك و كرامته**... جل و پۆشاکێکی شڕم لەبەر دابو، چومە لای پێغەمبەر، ئەویش پێی گوتم: ماڵو سامانت هەیە؟ گوتم: بەڵێ، فەرموی: چ جۆرە ماڵێک؟ گوتم: هەمو جۆرە

---

[1] أخرجه الترمذي (٢٨١٩) في الأدب من حديث عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده.

سامانێک، کە خوا پێی بەخشیوم: لە حوشترو مانگاو مەڕو مالاَت‌و ئەسپ، فەرموی: گەر خوا ماڵ و سامانی پێ بەخشیت، با شوێنەواری نیعمەت‌و ڕێزی خوا بەسەرتەوە ببینرێ)[1]

[1] أخرجه النسائي (١٩٦/٨) في الزينة، والأمام أحمد في (المسند) ٤٧٣/٣ واللفظ له.

# کێ لە بالاپۆشیی بەرپرسیارە؟

## یەکەم: ئافرەتی مسوڵمان:

ئافرەتی مسوڵمان هەر کاتێ خوێنی بێنوێژی (حیض)ی بینیو بلوغی بو، ژیر بو، ئەوا ئەرکی دینی بەسەردا پێویست دەبێت و، لەسەری واجبە، کە خۆی بالاپۆش بکات و پۆشاکی ئیسلامی بپۆشێ. وەک قورئان ئاراستەیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ﴿٥٩﴾ الأحزاب﴾ و ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ...﴿٣١﴾ النور﴾

پێغەمبەریش بە ئەسمای کچی ئەبو بەکری فەرمو (يا أسماء إن المرأة إذا بلغت المحيض لم تصلح أن يُرى منها إلاّ هذا و هذا و أشار إلى وجهه و كفيّه).

## دووەم: سەرپەرشتیار (ولی)ی ئافرەتەكە:

جا ئەو سەرپەرشتیارە باوک بێت، یان کوڕ بێت، یان برا بێت، یان مێرد بێت، ئەوا سەبارەت بە بالاپۆشیی نەکردن بەرپرسیارەو موحاسەبەی لەسەر دەکرێت. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾... ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! خۆتانو کەسو کاریشتان لەو ئاگرە بپارێزن، کە سوتەنیەکەی لە مەردم و بەردە. فریشتەی بە زەبرو زەنگو توندوتیژی لەسەرە، خوا چۆنیان فەرمان پێبدات، لە فەرمانی دەرناچنو هەرچی بەوانی دەسپێرێ بەجێی دێنن ﴿٦﴾ التحريم

ئەنەس گوتویەتی پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: (إن الله سائل كل راع عما إسترعاه، أحفظ ذلك أم ضيع؟ حتى يسأل الرجل عن أهل بيته... خوا لە هەمو بەرپرسێک دەپرسێتەوە دەربارەی ئەوانەی، کە لە

بەردەستی ئەودان، کە ئایا مافەکانی پاراستون، یان بەزایەی داون؟ تەنانەت پیاو دەربارەی ماڵ و منداڵی بەرپرسیارەی‌و لێی دەپرسریتەوە) [١]

کەواتە لەسەر هەمو سەرپەرشتیارێکی ئافرەتان پێویستەو دەبێ فەرمان بە ژن و کچانیان بکەن، کە خۆیان بالاپۆش بکەن و پۆشاکی ئیسلامی بپۆشن‌و کەمتەرخەمی تێدا نەکەن. جا گەر فەرمانی پێ نەکردن‌و خۆی لێ بێ ئاگاو بەرپرسیار نەکرد، ئەوا سنوری خوای شکاندوە و لە خوا یاخی بوەو تاوانبارو گوناهکاری گەورەیە. خوا دەفەرموێ: ﴿...تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا... ئەمە سنوری خوایە و مەیشکێنن ﴿٢٢٩﴾ البقرة﴾

---

[١] عزاه الألباني في (الصحيحة) رقم ١٦٣٦ الى النسائي في (عشرة النساء) والضياء في المختارة، وابن حبان في (صحيحه) وابن عدي في (الكامل).

## سێیەم: سەرۆک و دەسەڵاتداران:

دەسەڵاتدارانی وڵاتی مسوڵمانان بە پلەی سەرەکی بەرپرسیارن لە بالاپۆش کردنی ئافرەتان و، لەسەریان پێویستە ڕێ بە ئافرەتان نەدەن جل و پۆشاکێک بپۆشن، کە پێچەوانەی فەرمانی خوا بێت.

هەروا دەبێ دەزگاکانی ڕاگەیاندن بخاتە گەڕ بۆ هاندان و پاڵنانی ئافرەتان بۆ پۆشینی بالاپۆشیی و، رەواج نەدات بە دیاردەی سفوری.

لە هەموانیش گرنگتر، نەهێنانی جل و بەرگی ئامادە کراوو هاوردە، کە نامۆیە بە داب و نەریتی مسوڵمانان، هەروا بازرگانی کردنی، یاساغ (منع) بکات و ئاسانکاری بۆ نەکات و فرۆشتنیان قەدەغە بکات.

# چەند ڕێنماییەک
# بۆ ئافرەتانی باڵاپۆش و سەرپۆش بەسەر

١- ئەم پۆشاکە ناسنامەو کەسایەتی و بونی ئافرەتی مسوڵمانە، دەبێ ڕێزی بگرێ و بەگەورەی دابنێ و، ڕۆژیک لە ڕۆژان بە بیرو هزریدا نەیەت لەخۆی داماڵێ و، نابێ لەژێر فشارو گوشاری هیچ کەسێک، تەنازولی لەسەر بکات، چونکە ژیانی ڕاستەقینەی ئافرەتی مسوڵمان بەم پۆشاکەیە، کە خوا بۆی هەڵبژاردووە.

٢- زۆر ئاگادار بێ نەکەوێتە هەڵەی گەورەو زەقەوە، کە ببێتە نمونەی خراپ بۆ ئیسلام و، ئافرەتی باڵاپۆشی پێ لەکەدار بکرێ.

٣- بەجوانترین ئاداب و ڕەفتاری ئیسلامیانە هەڵسوکەوت بکات لە ماڵەوە، یان لە دەرەوەی ماڵ، بە تایبەتی لە فەرمانگە و دامەزراوەکانی میری. هەروا دەبێت لەگەڵ خوشکە مسوڵمانەکانیدا قسە شیرین و ڕوخۆش و سینە فراوان و لێبوردە بێت. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**الكلمة الطيبة صدقة**... وتەی جوان و قسەی خۆش و

خێرو سەدەقەیە))، ((تبسمك في وجه أخيك صدقة.. خەندەت بە ڕووی براکەت خێرو سەدەقەیە)). بەڵام دەبێت ئافرەت ئاگادار بێت، نابێت گاڵتەو سوعبەت و پێکەنین لەگەڵ پیاوانی بێگانەدا بکات، وەک لە فەرمانگەو دامەزراوەکان دەبینرێت، چونکە پیاوی دڵ نەخۆشی وا هەیە بە مەبەستێکی دیاریکراوەوە لێکی دەداتەوە.

٤- ئافرەتی مسوڵمان بە پۆشینی ئەم پۆشاکە پیرۆزە، دەبێت خۆی پێ ڕێزدار بێت و بزانێت خوا ڕێزی گرتوە، کە ئەم پۆشاکەی بۆ هەڵبژاردوە، تا بەهۆیەوە بەهەشت دەستەبەر بکات.

هەردەم خۆی بە ڕۆشنبیرتر بزانێت لەچاو ئافرەتانێ، کە ئەم پۆشاکە بە بەهاو پیرۆزە ناپۆشن و، دوای مۆدیل و ئافرەتی ڕۆژئاوایی بێ بەخت دەکەون، با ئەو ئافرەتە سفورانەش بەناو بڕوانامەی بەرزیشیان هەبێت، لەلای خوا، بەرزیو بەڕێزیو لەخواترسانو خۆپاریزی لە گوناهانە ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ الحجرات﴾.

# ناوەرۆک